# | بە عەلمانی کردنی کاری ئیسلامی
# لە نێوان پرۆگرامەکانی دەسەڵات وپەیڕەوی بە ناو بانگخوازان

-أبو عبدالله الميلودي زكريا

"کاری ئیسلامی"، دەستەواژەیەکی سەردەمە بۆ ناوبردنی کار وهەوڵی ئەو کۆمەڵ وتاکانەی کار بۆ گەڕاندنەوەی ئیسلام دەکەن بۆ واقیعی ئەم ئوممەتە - چ لە دەوڵەت وحوکمەت وچ لە کۆمەڵگا دا -. واتا ئەو بزاڤەی هەڵگرانی - بە پێی ئەوەی لە قسەو باسەکانیاندا ڕایدەگەیەنن - هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتێك لێ دەدەن حوکم بە ئیسلام بکات وکۆمەڵگایەك کە سەرچاوەی ژیانی تایبەت وگشتی خۆی لەو ئیسلامەوە وەرگرێ.

دروستبوونی ئەو بزاڤەش لەسەر دەستی کۆمەڵە خەڵکێکی جیاواز بووە لە ڕووی سەرچاوەو هەڵقولانی فیکری وئاڕاستەیانەوە، بەرامبەر بە دەوڵەتێك کە شەریعەتی لە کارخستووەو وحوکمی عەلمانی بڵاوی ئەمرۆی خستۆتە شوێنییەوە لە سیستەم ودام ودەزگاکاندا، لە بەرامبەر کۆمەڵگایەکی ژێردەستەی ئەو حوکمەتە، کە بە پێی سیاسەتی ئەو حوکمەتەوە دەجووڵێتەوە، ئەو سیاسەتانەی وایان لەو کۆمەڵگایە کردووە لە ڕاستییەکانی ئیسلام وحوکمەکانییەوە دوور بێت ولێیان ناحاڵی بێ.

هەروەك كاریگەر بوونی ئەو بزاڤە بە كۆمەڵە هۆكار وئامرازێكی هەڵقوڵاوی ئەو كەش وهەوایەی لە سەرەتای دروستبوونی ورێڕەوی گەشەكردنیدا تێیدا بوو، وای كردبوو لە بزاڤێكەوە بۆ هێنانەوەی ئیسلام ونوێكردنەوەیدا ببێتە هەوڵێك بۆ چەسپاندن وسەلماندنی عەلمانیەت وداكوتانیدا وبەشداربوون لە بەردەوامێتی عەلمانیەتدا، لەسەر هەردوو ئاستی حوكمەت وكۆمەڵگا.

ئەوەش دەتوانین زۆر بە ڕوونی لە شێوازی دامەزراندنی كار ورێڕەوی زۆرێك لە هەڵگرانی دروشمی بانگەواز وكاری ئیسلامیدا ببینین، بە تاك وبە ئەندامی جەماعەتەكانەوە - چ پیاوچاك وخواپەرست بن وچ زانا ومامۆستا وخوێندكاری زانستی شەرعی وبانگخوازان - كە وای لێهاتووە بە تەنها ئامرازێك بن بۆ ئەوەی چینی دینداری كۆمەڵگا بۆ دروستكردنی هاوسەنگ بوونی سیاسی لە وڵاتدا بەكاربرێت، كە ئامانجی حوكمەت لە دابەشكردنی هێزە كاریگەرەكانی كۆمەڵگا بۆ چەندین حیزب وپارت ولایەن دێنێتە جێ، بە شێوەیەك كە بە لاوازییان بگەینێت‌و، هەر كاتێكیش بەرژەوەندی خۆی لەوەدا بوو ئەو هێزانە بكەونە گیانی یەكترو تێك بەربن ئەوە لە یەكیان دەدات، بۆ ئەوەی مەترسی كۆبوونەوەی گەل لە دەوری یەك پەیڕەو وسەركردایەتیدا نەمێنێت‌و، بۆ بەردەوامی دان بە سەقامگیری وبەردوام بوونی ئەو ڕژێمەو ڕەگ داكوتانی چەمكەكانی دەسەڵات لە حوكمڕانی وسیاسەتی بەڕێوەبردندا !

## یەكەم؛ ڕۆڵی حوكمەت لە بە عەلمانی كردنی كاری ئیسلامی وسیاسەتی دەسەڵات لەم بوارەدا:

حوكمەت ودەسەڵات توانیان ئامانجی خۆیان لە بە عەلمانی كردنی بزاڤی كۆمەڵایەتی وسیاسی لە وڵاتدا بێننە دی، - بەو بزاڤەشەوە كە بە "بزاڤی ئیسلامی" ناسراوە - لە ڕێگەی كۆمەڵە ڕێوشوێنێكی گشتی یا تایبەتەوە.

لێرەدا باسی بڕێکیان دەکەین:

١) سەپاندنی یاسایەکی سیکولار وعەلمانی لە بواری دامەزراندن ومۆڵەت دان بە هەر دەزگاو چالاکییەکی سیاسی وکۆمەلایەتی - بەو دەزگا وچالاکیانەشەوە کە لە ژێر دروشمی کار کردن بۆ ئیسلام دا دەجووڵێنەوە - وبەکارهێنانی ئەو یاسایە بۆ ئاڕاستەکردنی ئەو دەزگا وچالاکیانە بەو ئاڕاستەیەی کە خزمەت بە پەیڕەوی سیکولار دەکات وبارەکە بەو سەرەنجامەوە دەگەینێت.

٢) لە چوارچێوە خستنی کاری بانگەواز وەك هەر کار وچالاکییەکی تر، بە گرتنەبەری سیاسەتێکی تایبەتی مۆڵەت پێدان بە دەزگاو وچالاکییە تایبەتەکان وئەو چالاکیانەی بە بەرژەوەندی گشتییەوە بەستن، لە ڕێی کۆمەڵە یاسایەکی سەرەکییەوە بۆ ئەوەی لە ژێر چەتری هەمان یاسای عەلمانی گشتیدا کار وچالاکییەکان بچن بەرێوە.

ئەم یاسایانەش کۆمەڵە یاسایەکن کە دین وسیاسەت لێك جیا دەکەنەوە، تەنانەت لە بیروباوەڕی تاکە کەسیشداو، ڕێگە نادەن ئیسلام دەست لە پرسی گشتی کۆمەڵگاو دام ودەزگاکانی حوکمەت وەرداو، کۆکردنەوەی خەڵك بە دەوری هەر کارێکی ئاینی بێت یا کارێکی گشتی ژیان لەسەر ئەساسی دین وسیاسەتی شەرعی قەدەغە دەکەن‌و، لە ڕێی کۆمەڵە دەقێکی یاسایی وسزای ئاماژەپێکراودا لێپرسینەوەو سزا بۆ ئەو کارانە دیاری دەکەن‌و، تەنها لە حاڵەتێکدا ڕێگە بە دروستبوون ورێکخستنی کاری ئیسلامی دەدەن - هەم لە ڕووی بیر وباوەڕ وهەم لە قسەو کردارەوە - کە بەو ئالیات ورێوشوێنە عەلمانیانەوە بەڕێوە بچێت کە بە ڕێوشوێن وئامرازی "دیموکراسی" ناسراون !

٣) ئاراستەکردنی ئەو دام ودەزگایانەی پەیوەستن بە بانگەواز - وەك مزگەوت وپەیمانگا ئاینییەکان وتا دوایی - لە ڕێی ئەو چوارچێوانەدا کە بەڕێوەبردنی کار وباریان لە ئەستۆیەو لە ڕێی ئەو پرۆگرامانەی لە ئاراستەیەکدا دانراون کە هیچ دەستوەردانێکی ئیسلام لە پرسی گشتی وبیر وباوەڕی خەڵك وقسەو گوفتارەکانیان دا نەهێڵن، تەنها بە کارهێنانی برێك لە کار وکردار ودروشم وگوفتارەکانی ئیسلام نەبێت بۆ سەلماندنی عەلمانیەت لە تەواوی لایەنەکانی ژیان ودانانی بنەمای بوون وبەردەوامێتی ودەسەڵات وچەسپاندنی پلانەکانیدا، دوای ئەوەی ئەو دروشم وگوفتار وکردارانە لە کرۆکی ڕاستیاندا دادەماڵرێن وبە لێکدانەوەی نادروست ولێك جیاکردنەوەی تێکدەرانەوە لە ڕاستیی خۆیان دا لادەبرێن.

٤) دروستکردن ودامەزراندنی کۆمەڵە دەزگایەك کە لە ژێر نێوی "ئیسلام" دا کار دەکەن ولافی بەڕێوەبردنی کار وباری ئیسلام لیَ ئەدەن – وەك وەزارەتی ئەوقاف وئەنجومەنە زانستییەکان ودەزگاکانی بانگەواز وئەو حیزبانەی لافی کار کردن بۆ ئیسلام لێدەدەن وتا دوایی – بۆ دژایەتی کردنی دام ودەزگاکانی بانگەواز کە زانایان وبانگخوازانی ڕۆڵەی پەرۆشی ئیسلام بەڕێوەیان دەبەن، لە هەوڵێکدا بۆ بیَ ئەرزش کردنی کاری ئیسلامی وپینە پەڕۆی سیاسەتەکانی ڕاگەیاندنی حوکمەت ودەسەڵات.

٥) گرتنەبەری سیاسەتێکی گشتی بۆ گەیشتن بە ئامانجی جیاکردنەوەی دەروونی وفیکری وپراکتیکی ئیسلام لە ژیانی تایبەت وگشتی کۆمەڵگاوە - لەسەر ئاستی بەڕێوەبردن ودادگا وڕاگەیاندن وپەروەردەو ئابووری وکۆمەڵگاو سیاسەت - لە ڕێگەی ئەو سیستەم وڕێوشوێن وسیاسەتە جاهیلیانەی چ بە زۆر بیَ وچ بە ڕازاندنەوەو بانگەشە بۆ کردنەوە بیَ دەسەپێنرێن، ئەوەش وایکردووە کۆمەڵە تێکەڵ وپێکەڵی ولادانێکی مەترسیدار لە ژیانی زۆربەی بانگخوازان وهەڵگرانی کار وخوێندکارانی کاری ئیسلامیدا بە هۆی کاریگەری واقیعی کۆمەڵگاو واقیعی سەرانی بانگخواز بە تایبەتی ڕووبدات، کە ئەو دیمەنە

عەلمانیانەی لە فیکر وگوفتار وکردار وپلانی ئەو بانگخوازانە هێناوەتە کایەوە، لە ڕێی تێکەڵاو بوونیان بە کۆمەڵگاو ژیان وگوزەرانی ناشەرعییان لەو کۆمەڵگانەدا.

تا وای لە زۆرێك لەو خەڵکانە کردووە کە بڕوایان بە کوفری عەلمانیەت وکوفری یاسا دیموکراسییەکانی وهەڵگرانی ئەو عەلمانیەتە هەیە، کە بەشێکیان هەر لەو خەواریجانەن کە خەڵك بە گوناهی کەبیرەوە تەکفیر دەکەن - واز لەو بزووتنەوە بیدعیانە بێنە کە لە شیرکی عەلمانیەتدا بەشدارن - بگەنە ئەو ڕادەیەی کە چیتر نەتوانن لە چوارچێوەی ئەو عەلمانیەتەدا بێنە دەرەوە، بۆیە دەبینی لە کاتێکدا کە تانەو تەشەر لە جەماعەتی هەڵبژاردن وئەو کەسانە دەدەن کە خۆیان بۆ پەرلەمان وئەنجومەنی یاسادانانی شیرکی وتاغووتی دەپاڵێونو، هێرش دەکەنە سەر هەر کەسێك کە لە دام ودەزگاکانی حوکمەت دا کار بکا، لە هەمان ئەو کاتەدا دەگەڕێنەوە سەر یاساو ڕێساکانی جاهیلیەت وئەو بڕیارانەی لەو ئەنجومەنانەوە دەردەچن وکارمەندانی حوکمەت هەر ئەو یاساو ڕێسایانە بەجێ دەگەینن، ولە زۆرێك لە کاروباری دین وژیانیاندا - واتا ئەو بانگخواز وکارکەرانە بۆ ئیسلام - دەگەڕێنەوە لای ئەو یاساو ڕێساو دام ودەزگایانەوە.

تەنانەت کەسی وایان تیایە بە مۆڵەتی عەلمانیەکان وپیرۆزباییان نەبێ ناتوانێ شووکردنێك وتەڵاقێك بدات، ولە برایانی دینی خۆی زیاتر متمانەی بەوان هەیەو، کە تووشی کێشەو گرفتێکی ژیان ئەبێ نایباتەوە بەردەم حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی بەڵام ئەیباتەوە بەردەم دادگای دەستوور ویاساوە !

## دووەم؛ ڕۆڵی بە ناو بانگخوازان لە بە عەلمانی کردنی کاری ئیسلامی:

هەر وەك چۆنی ڕۆڵی دەسەڵاتیش لە بە عەلمانی کردنی کاری ئیسلامیدا مەترسیدار بوو، کە وای کردبوو بانگخوازان بکەونە نێو گۆماوی جاهیلیەتی هاوچەرخەوە بە تەواوی دیمەن وبنبەستەکانی، بە هەمان شێوە ڕۆڵی بە ناو بانگخوازان ونسبەت دراوان بە زانست وپیاوچاکی ولایەنی ترەوە مەترسیدار وڕووخێنەر بوو، ولە کاری ڕژێمە دەسەڵاتدارەکان بەرامبەر بە ئیسلام وئوممەت زیان کەمتر بوو.

چونکە هەمان ئەو کۆمەڵەی بۆ دەرهێنانی دەسەڵات وکۆمەڵگا لە ژێر چەپۆکی حوکمڕانی شیرکی باوی ئەم ڕۆژگارەدا هەڵسابوو، ومەبەستی بوو بیانگەڕێنێتەوە ژێر حوکمی یەکتاپەرستی وئیسلامەوە، بوو بە ڤایرۆسێك کە عەلمانیەتی بە نێوی ئیسلامەوە لەخۆدا گرتووەو، هەر دەرگایەك لە فیکری کۆمەڵگاو ژیانیدا بە ڕووی عەلمانیەت دا سەخت بێ ئەو ئەیشکێنێت، وبەو شێوەیە بووە بە ئامرازێکی بە هێزکەر وپەرەسێنەر ویارمەتیدەری عەلمانیەکان بۆ ئەوەی مەبەستەکانیان لە بە عەلمانی کردنی دەسەڵات وکۆمەڵگا بێننە جێ، ولە بەردەوام بوون وسەقامگیری ڕژێم ودام ودەزگا جاهیلییەکانی ئەمڕۆدا.

دەکرێ ئەو دیاردانەی بەڵگەی ئەو ڕۆڵە تێکدەرەن کە بووە هۆکاری عەلمانی کردنی کاری ئیسلامی لە چەند وێنەو دیمەنێکدا پوخت وکورت کەینەوە؛

١) قبووڵکردن ودان نان بە سیستم ودەزگا عەلمانیەکان، کە ئیسلامی سەردەمی ئەووەڵ هەر بۆ ڕووخاندن ونەهێشتنی ئەو سیستم ودەزگایانە هاتبووە بوون وبۆ ئەوەی ڕژێم سیستمی شەرعییان لە شوێندا دامەزرێنێت کە مرۆڤ - بە تاك وکۆمەڵەوە - بە حوکمی خوای پەروەردگار وشەریعەتەکانی دینەکەی حوکمکەن، تاوەکو بەندایەتی خوای پەروەردگار لە زەمینداو دژایەتی کردنی هەر بەندایەتی کردنێك بۆ غەیری خوای پەروەردگار بێتە دی.

ئەم دان پیانان وقبوولکردنەی کوفریش هەڵوەشێنەرەوەی یەکتاپەرستییەو، بووە هۆی ئەوەی هاوەڵ بۆ خوای پەروەردگار لە بیر وباوەڕ وگوفتار وکرداردا قەراردرێت‌و، وای لە خاوەنی ئەو بەرنامانە کرد کە ئیسلام وبانگەوازەکەی بخەنە ژێر دەستی تاغووتەکان وحوکم ودەسەڵاتیان ودەرگایەکی پان وبەرینیان لەبەردەمدا بکەنەوە بۆ ئەوەی دەست لە دین وئوممەت وەردەن وخۆیان لە خەڵك بکەنە کوێخاو خوداوەند وپەرستراو.

٢) داوەری کردنی سیستەم ویاسا عەلمانیەکان لە تێگەیشتنی ئیسلام‌و واقیع‌و، ڕێبازی بەکارخستنی ئیسلام لە واقیعدا.

نیشانەکەشی لەوەدایە کە خاوەنی ئەو بانگەوازە بیدعیانە کۆمەڵە شتێکی دژ بە یەك لە یەك بازنەدا کۆدەکەنەوە، کە ئەبینی لە هەمان ئەو کاتەی بە گشتی بانگەشە بۆ دینی ئیسلام دەکەن؛ بانگەشە بۆ "میللەتی دیموکراسی" دەکەن ! ئەو کاتەیە کە حوکمێکی شەرعی پاك وبێگەردی خوای پەروەردگار لەگەڵ شەریعەتی دەستوور ویاسادا دەگونجێت بڵاوی دەکەنەوەو خەڵکی بۆ بانگێشت دەکەن، کە پێچەوانەی ئەو دەستوور ویاسایەش بوو دەنگی لێ هەڵنابرن وناهێڵن بانگەوازی بۆ بکرێت، یا ئەوەتا بە ئاڕاستەیەکی لاری تریدا دەبەن بۆ ئەوەی لەگەڵ حوکمی دەستوور ویاساوە تێك کاتەوە، بەڵکو دەبینی لە کاتێکی زۆردا ڕەخنە لەو کەسانە دەگرن کە پێچەوانەی حوکم ورێسا یاساییەکان کار دەکەن، کە چی پێیان وا نییە هیچ لەوە شتێك لە ئیسلامەکەیان کەمکاتەوە یا پێچەوانەی ئەو دینداریییەیان بێ !

٣) کار لە ژێر چەتری سیستەم ودام ودەزگا عەلمانیەکانداو، بە هێزکردن وبەرەو پێش بردن وبەردەوامی دان بەو سیستەمانە؛ لە ڕێی ئیعتیراف کردن بەو سیستەمانەو قبووڵکردنی ئەندامێتییان‌و دان نان بە کارەکانیان وپیرۆزبایی لێکردن وبانگهێشتی خەڵك بۆ ئەوەی بچنە نێو ئەو سیستەمانەوە، کاتێك کە لە پەرلەمانەکاندا بەشدار دەبن وقبووڵ بە

ئەندامێتی ئەو ئەنجومەنانە دەکەن ودان بە ئەرکیان دا دەنێن وهاوبەشیان ئەبن لە یاساداناںو ئیعتیراف بە شەرعیەتی بوون وئەرکیان دەکەن وداوا لە خەڵك دەکەن بەشدار بن لە دامەزراندنیاندا وبچنە ژێر ڕێساو بڕیارەکانیانەوە.

٤) دژایەتی کردنی سیستم ودام ودەزگا ئیسلامییەکان وهاوکاری کردن لە ڕاگرتن ولەکارخستنی ئەو دام ودەزگایانەدا، کاتێك کە قبووڵ بە سیستم ودام ودەزگا جاهیلییە عەلمانییەکانی پێچەوانەیان دەکەن وتەبەرا لە هەر کەسێك دەکەن ئەو سیستمانە ڕەتداتەوەو دژایەتی خەڵکەکەیان بکات، ناوزڕاندنی ئەو خەڵکەو هاندانی خەڵك لە دژیانداو یارمەتیدانی نەیارانیان، وەك چۆن بەناو بانگخوازانی ئەهلی بیدعەو تەفرەقەی بە عەلمانی بووەکان ئەیکەن.

کە ئینکار لەسەر هەر مرۆڤێکی یەکتاپەرست دەکەن ئەو سیستم ودام ودەزگایانە - بە ورد ودرشتەوە - ڕەتکاتەوەو لە بەردەم تەواوی خەڵکدا لە بەیاننامەو گوفتار ونووسینەکانیاندا تەبەرای خۆیان لە جیهاد وموجاهیدان ڕادەگەینن، ئەو موجاهیدانەی ڕێچکەی ئەهلی سوننەت وجەماعەتیان لە ڕەتدانەوەی شیرکی عەلمانیەت ودژایەتی کردنی ئەهلی ریدەو هەڵگەڕانەوە لە دیندا گرتۆتە بەر، کە ڕێگەی زەندیق وعەلمانی وسیکولارەکانە.

٥) پەروەردە کردنی موسوڵمانان لەسەر عەلمانیەت لە بیر وباوەڕ وگوفتار وکرداردا، لە ڕێی ڕێکخستن وچالاکییە بیدعیەکانیانەوە.

تا وای لێهاتووە زۆرێك لەو بە ناو بانگخوازانەی لافی سەرخستنی دین لێئەدەن؛ هیچ توانجێك لە ڕیزگرتن لە عەلمانیەت وپەیوەست بوون بە سیستم وحوکم وڕێوشوێنەکانی نەبینن‌و، بێ لە مۆڵەتی عەلمانی وچوارچێوە یاساییەکانیانەوە بەرەو هیچ دەرس

وموحازەرەو یارمەتیدانی لێقەوماو وموحتاج ودڵدانەوەی لاواز وبەستەزمانێك نەجووڵێنەوە، تەنها بەو ئاڕاستەیە نەبێ کە یاساو ڕێساکانیان ڕێگەیان پێداوە، لەگەڵ هەموو ئەوەش فێڵ لە خۆیان ولە خەڵك دەکەن کە خاوەن خێر وهیدایەتنو ئەهلی ڕاستی ودروستی وڕاستەڕێی بێ خواری ولارین، کەچی بەو کار وکردارانەیان دوورترین کەسن لە پەیامبەر وپیاوچاکانەوە.

لە کۆتادا ..

کاریگەری عەلمانیەت لە واقیعی موسوڵمانان وایکردووە بانگەواز ببێتە بانگەوازێکی تر وبانگخوازانی یەکتاپەرستی لە ناو بانگخوازانی عەلمانیەت وئیرجائدا کۆمەڵێکی کەم ونامۆ وغەریب بنو، وای لێهاتووە زۆربەی خەڵك بێ ئەوەی هەست پێبکەن بە ئاڕاستەی عەلمانیەتەوە ژیان کەنو، دەسەڵات وحیزبەکانی لە لایەکەوەو بە ناو بانگخوازان لە لایەکی ترەوە هاوکاری یەك بن لە زیاتر ڕۆچوونی ئوممەت لە عەلمانیەتدا، تا وای لێهات مەشخەڵی یەکتاپەرستی لەم ئوممەتەدا گوم بن ولە بەرامبەر زەبر وزەنگی دیاردەکانی جاهیلیەتدا بکوژێنەوەو، ئەوەی لەو نێوەدا ماوەتەوە تەنها کۆمەڵە دروشمێکن نە حەقێکیان پێوەیەو نە دەلیلی هیدایەت وڕێنموونییەکن.

والله المستعان.

